# بەراوردێک

## لەنێوان

## ئافرەتانی موسڵمان و

## ناموسڵمان



ئامادەکردنی
کتێبخانەی صلاح الدین

238 posts | 19.2k followers | 7 following

Promote | Edit Profile

پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی PDF 📚

Public Figure

لێرە

باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان

بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

.

Ganjyna

.

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەکان

drive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsIbo_

Ktebi_PDF

# بەراوردێك

## لە نێوان

## ئافرەتانی موسڵمان و

## ناموسڵمان!!!!

# بەراوردێک

## لە نێوان
## ئافرەتانی موسوڵمان و
## ناموسوڵمان!!!!

ئامادەکردنی

بەشی زانستی لەکتێبخانەی صلاح الدین

٢٠١٤ز

ئـــەو زانیاریانەی لەم بڵاوکراوەیـــەدا بەدی دەکرێن ماوەی (١٠) مانگـــی خایاندووە تاکو لە ســـەرچاوە ڕۆژئاواییەکان کۆکراونەتەوەو خراونەتە بەردەست پاشان پشت ڕاستکراونەتەوە، واتە: ئەم بەدواداچوونە نزیکەی ١٤٠٠ کاتژمێری ویستووە.

بـــۆ دڵنیابوونی زیاتـــرو ڕەواندنەوەی گومانـــەکان هەموو ئەو زانیاریانەی لەم بڵاوکراوەیـــەدا دەبیندرێن بەراورد کراون لەگەڵ پێگەی (شبهات وبیان: www.shobohat.com)، کە ئەم پێگەیە هاوتایە لەگەڵ ســـەرچاوە سەرەکییەکانی ئەم زانیارییانە[1].




**میدیای گێرەشـــێوێن هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ شێواندنی وێنـــەی ئافرەتی موســـڵمان کـــە ئەمـــەش بووەتە هۆی دروستکردنی ئەو تێڕوانینە هەڵەیەی کە دوترێت: ئافرەتی**

(١) هەموو لینکەکان تاقیکراونەتەوە و کاردەکەن

موسڵمان هەمیشــە لە ژێر حیجابدا چەوسێندراوەتەوەو ســتەمی لێکراوە. لە بەرامبەر ئەم قسە نارەوایە زۆربەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ســەردەم بەسەرجەم هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیانەوە؛ ژیان و گوزەرانی ئافرەتانی ناموســڵمان بە جوانترین شــێوەو وێنە دەخەنە ڕوو، هەوڵدەدات تەنها ئەو ســاتانەی ئافرەتە ناموســڵمانەکان بخاتە ڕوو کە لە گوزەرانێکی باشــدان؛ بەڵام خۆی لادەدات لەو ســاتانە مەرگەساتانەی ئافرەتە ناموسڵمانەکان تێیدا دەگوزەرێن، ئـــەو ژیانە تاڵەیان ناخاتەڕوو کە داپۆشــەری هەموو ئەو بەناو خۆشییانەیە کە دەخرێنە ڕوو، ئەم جۆرە ڕاگەیاندنە نادادپــەروەرە کاریگەری هەبووە لەســەر بەشــێکی زۆر لە مســـوڵمانەکان و بۆچوونیانی گۆڕیوە؛ بەشــێوەیەك وا هەستدەکەن کە ئافرەتی ناموســڵمان بە ئارەزووی خۆی لە کەنـــار ڕووبارەکان و مێرگەکاندا بە خۆشــی و بێباك ڕادەبوێرن، هیچ کەسێك چاودێریان نییەو لێپێچینەوەیان لەگەڵدا ناکات.

بەڵام ڕاستیەکە چییە؟
چی دەگوزەرێ لە ناو ماڵەکاندا؟
چی دەگوزەرێ لە شوێنەکانی کارکردندا؟
چی دەگوزەرێ لەودیو پەردەی ڕاگەیاندن؟
باپێکەوە بچینە ئەم شــوێنانە و ڕاســتییەکە لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکانەوە ببینین.

# بەکارهێنانی ئافرەت بۆ مەبەستی سێکسی (قۆستنەوەی سێکسی)

لەکۆمەڵگای ناموسڵماندا پیاوان ئازادی قۆرخکردن و بەکارهێنانی ئافرەتانیان پێدراوە بەبێ هیچ ماف و هاوسەرگیریەك. زۆرێك لە پیاوان وەك کاڵا مامەڵە لەگەڵ ئافرەتان دەکەن هەرچەندە کاڵاکە باشتر بێت بەڵام بە هۆی پارەوە دەست دەکەوێت. وە ئەگەر یەکێکیان بەهۆی ئەم پەیوەندیە ناشەرعیانەوە مناڵی بوو ئەوا پێویستە لەسەری بەرپرسیارێتی پەروەردەکردنی منالەکان بگرێتەئەستۆ یا ئەوەتا پەنابەرێتە بەر لەباربردن.




لە ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا (١٠) ملیۆن خێزان بە تەنها دایك بژێویەکەی دابین دەکات (بەبێ بوونی باوك).

سەرچاوە: دەزگای ئاماری ئەمریکی

http://www.census.gov/population www/socdemo/hh-fam/p20-561.pdf

**لە ئەمریکا بەتەنها ساڵانە زیاتر لە یەك ملیۆن منداڵ بە لەباربردن دەکوژرێت.**

سەرچاوە: ناوەندە ئەمریکیە حکومیەکان بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشیەکان.
http://www.cdc.gov/mmwr/preview/mmwrhtml/ss5511a1.htm

**تەنها لە ئەمەریکا (٤٢) ملیۆن کۆرپەلە بە لەباربردن کوژراون لەساڵی (١٩٧٣ تا ٢٠٠٢)[١] .**

سەرچاوە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.






---

[١] وە ڕێژەکە تا ساڵی (٢٠١١) گەیشتووەتە نزیکی ٥٣ ملیۆن

## بەڵام ئافرەتی موسڵمان بەمانەی خوارەوە جیادەکرێنەوە:

لـــە کۆمەڵگای موســـڵماناندا پەیوەندی نێـــوان پیاو و ئافرەت پەیوەندییەکی ڕاســـتگۆیانەیە و بە هاوسەرگیری شەرعی دڵنیاکراوەتەوە لەپێناو پاراستنی مافی ئافرەتان و منداڵان. لە هاوســـەرگیری ئیسلامیدا مێرد خۆشەویستی ڕاســـتەقینەیە و ئەوپەڕی بایەخدانی خۆی نیشـــاندەدات بۆیەش زاوا ئەوەندەی هەیەتی سەرفی دەکات بۆ دابینکردنی مارەیی و بەخشین بە خۆشەویستەکەی و بنیاتنانی ماڵێك کە هەردووکیان ژیانێکی جوان و ئاســـوودە و هەمیشەیی تێدابەرنەسەر.

### نەخۆشیە سێکسیەکان

ڕووتـــی و تێکەڵاوی بوونەتـــە هـــۆی بڵاوبوونەوەی لە ڕادەبەدەری نەخۆشیە سێکسیەکان، دوای ئەوەی ئافرەتی



خۆرئاوایی ئـــازاری ناپاکی و جیابوونەوە دەچێژێت بەهۆی پەیوەندییـــە دووبارەبووەکانـــی لەگەڵ پیاوان، ســـەرەڕای ئەوەش پیاوەکان چەندان نەخۆشی سێکسی تووش دەکەن کە چارەسەری ناکرێت.

لە ئەمریکا زیاتر لە (٦٥) ملیۆن کەس تووشی نەخۆشی سێکسی بوون کە چارەسەری ناکرێت.

ســـەرچاوە: ســـی ئێن ئێن و ناوەندە ئەمریکیە حکومیەکان بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشیەکاندا

http://www.cnn.com/2006/HEALTH/conditions/11/22/tbr.numbers.hiv/index.html
http://www.cdc.gov/STD/Trends2000/Trends2000.pdf

## بەڵام ئافرەتی موسڵمان بەمە جیادەکرێتەوە:

کاتێك ئیســـلام هەســـتا بە قەدەغەکردنـــی پەیوەندییە سێکسیەکانی دەرەوەی هاوسەرگیری سەرەڕای ڕێوشوێنە خۆپارێزیەکان وەك فرمانکردن بە حیجاب و قەدەغەکردنی تێکەڵاوی ئەمە بووە هۆی پاراستنی ئافرەتی موسڵمان لە نەخۆشیە سێکسیەکان.

## بەسەیرکردنی ڕێژەی ئایدز دەتوانین بزانین کە وڵاتە موسڵمانەکان چۆنن:

ڕەنگە سەوزەکە ئەو وڵاتانەن کە کەمترین تووشبوون بە ئایدزیان تێدایە بەپێی ئامارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.
وڵاتە ئیسلامیەکان لەناو وڵاتانی جیهاندا کەمترین تووشبوون بەئایدز وە کەمترینیشیان سعودیەیە.




ئیسلام موعجیزەی نیشاندا.
ئیسلام ڕووی زەوی گۆڕی.



# توندوتیژی خێزانی

**لە (٤٠٪ بۆ ٥٠٪)ی ئافرەتە کوژراوەکان لە ئەمریکا بکوژەکەی هاوبەشە گیانی بەگیانی یەکەیەتی (مێرد یان هاوڕێ).**

سەرچاوە: وەزارەتی دادی ئەمریکی

http://www.nij.gov/topics/crime/intimate-partner-violence/extent.htm



**ساڵانە (١٣٢٠) ئافرەت لە ئەمریکا دەکوژرێن (واتە نزیکەی (٤) ئافرەت ڕۆژانە دەکوژرێن) لەلایەن مێرد یان هاوڕێکانیانەوە.**

سەرچاوە: ڕاپۆرتێکی وەزارەتی دادی ئەمریکی

http://www.ncjrs.gov/pdffiles1/nij/199701_sectionI.pdf

سالآنە نزیکەی (٣ تا ٤) ملیۆن ئافرەت لە ئەمریکا ڕووبەڕووی دەستدرێژی جەستەیی دەبنەوە لەلایەن مێرد یان هاوڕێکانیانەوە.

سەرچاوە: پەیمانگاکانی تەندروستی ئەمریکی

http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/7960871



## بەڵام ئافرەتی موسڵمان بەوە جیادەکرێتەوە:

کە یەکێك لە گەورەترین هۆکارەکانی ئەم توندوتیژیە خێزانیە چەند شتێکە کە ئیسلام قەدەغەی کردووە وەك خواردنەوەی مەی کە ژیری ناهێڵێت، هەروەها بڵاوبوونەوەی تێکەڵاوی نێوان هەردووك ڕەگەزەکە کە سەردەکێشێت بۆ ناپاکی هاوسەری و دروستکردنی گومان- لەنێوانیاندا - کە ئەمەش هۆکاری ئەم توندوتیژیە.

(٨٩ ٪)ی خزمەتگوزار و کرێکارەکانی پاککردنەوە ئافرەتن.
(٩٧ ٪)ی پیشە سکرتێریەکان ئافرەتان پێی هەڵدەستن.
(٩٣ ٪)ی فەرمانبەرانی پرسگە ئافرەتن.
(٧٤ ٪)ی شاگردی چێشتخانەکان ئافرەتن.
سەرچاوە: وەزارەتی کاری ئەمریکی
http://www.dol.gov/wb/factsheets/20lead2007.htm



لەجیاتی چێشت لێنان لە ماڵەکەی خۆیدا دەچێتە دەرەوەی ماڵ چێشت لێدەنێت و خزمەتی خەڵکدەکات لە چێشتخانەکاندا.
لەبری پاککردنەوەی ماڵەکەی خۆی دەچێت سەرناوەکان پاك دەکاتەوە لە ئوتێل و نەخۆشخانە و شوێنە گشتیەکان.
لەبری قبوڵکردنی سەرپەرشتیاریی هاوسەرەکەی وەك سەرۆك خێزانێك دەچێت کەسە بێگانەکان قبوڵ دەکات تا

ننە سەرۆك بەسەرییەوە لەكاركردندا و دەبێتە سكرتێرەی ئەوان، لەبری شوێنكارێكی دڵنیا و ئەمن لەماڵەوە دەچێت كاردەكات و تێكەڵ بە پیاوان دەبێت و ڕووبەڕووی سەركووتكردن و هەڕەشە و گێچەڵكی سێكسی دەبێتەوە بەرێژەیەكی زۆرو لەڕادەبەدەر.

لێكۆڵینەوەیەك كە وەزارەتی بەرگری ئەمریكی پێی هەستابوو جەختی لەوەكردەوە كە (٧٨٪)ی ئافرەتان لە هێزە سەربازییەكاندا تووشی گێچەڵكی سێكسی دەبنەوە لەلایەن فەرمانبەرە سەربازییەكان.

سەرچاوە: وەزارەتی كاروباری خزمەتی سەربازی ئەمریكی (Veterans Affairs)
http://www.rehab.research.va.gov/jour/08/45/3/pdf/Street.pdf



## لە ئەمریکا (٧٠٪)ی پەرستارەکان ڕووبەڕووی گێچەڵکی سێکسی دەبنەوە لەلایەن هاوڕێ کارەکانیان و نەخۆشەکان.

سەرچاوە: پەیمانگا نیشتمانیەکانی تەندروستی (پاشکۆی وەزارەتی تەندروستی ئەمریکی)

http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pubmed/8006699



بەڵام ئەوانەی خۆشبەخت نین لە ئافرەتانی خۆرئاوا...

**خۆرئاوا مافی ئافرەتی لەسەر سەرپەرشتیارەکەی (وەلی) لاداوە لە دابینکردنی بژێوی (نفقە) بەڵکو ئەمەی خستۆتە ئەستۆی ئافرەتەکە، ئەمەش ئافرەتەکەی ناچارکردووە پەنابەرێتە بەر بوارەکانی کارکردنی پیاوان تا پاروویەکی ژیانی بەدەست بهێنێت، بەمەش زۆربەیان بوونەتە قوربانی قۆستنەوەی سێکسی لەلایەن پیاوانەوە، ئەوەش وایکردووە هەموو داوێن پیسێك بتوانێت گاڵتە بە ناموس و شەرەفیان بکات.**

لە ئەمریکا و ئەوروپا چەندان چێشتخانە بڵاوبوونەتەوە کە خواردن لەسەر جەستەی ئافرەتی ڕووت پێشکەش دەکەن.

ئەو ئافرەتانەی کە نەیانتوانیوە کێبڕکێی پیاوان بکەن لە سەیارە شۆردندا پەنایان بردوەتە بەر ئیشکردن بەڕووتی لە ئوسترالیا و بەریتانیا.

سەرچاوە: ڕۆیتەرز و بی بی سی

http://www.reuters.com/article/oddlyEnoughNews/idUSSYD8075020070517
http://news.bbc.co.uk/2/hi/uk_news/england/leicestershire/4889570.stm

وە قۆستنەوەی جەستەی ئافرەتان بە چەندان شێوەی جۆراوجۆری بەرەڵایی بووەتە پیشەیەك کە بەهۆیەوە ساڵانە (١٢) ملیار دۆلار وەدەست دەهێنرێت لە ئەمریکا بەتەنها.

سەرچاوە: ڕۆیتەرز
http://www.reuters.com/article/2009/06/12/us-porn-hiv-idUSTRE55B59520090612

(٥٠) هەزار ئافرەت و منال ساڵانە دزەیان پێدەکرێتە ناو ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ بەکۆیلەکردن و قۆستنەوە و بەکارهێنانیان بۆ لایەنی سێکسی.

سەرچاوە: وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا
http://www.state.gov/documents/organization/10815.pdf

# بەڵام ئافرەتی موسڵمان بەوە جیادەکرێتەوە:

کە ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت ناوە و قەدەغەی کردووە لەوەی بکرێنە کۆیلە لەلایەن کەسانی تر و ئارەزووەکانیانەوە، جا ڕێزی لێگرتوون و بەرەڵایی و بەکارهێنانی جەستەی ئافرەتانی بۆ وروژاندنی ئارەزووەکان و دەستکەوتنی قازانج لێیان قەدەغەکردووە وە پیاوانی پابەند کردووە بەدابین کردنی بژێوی بۆ ئافرەتان.

لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا ئافرەت بە سەربەرزی و ڕێز و شکۆوە دەژیت.






## ئایا ڕاستی حیجاب چییە؟

کاتێك خۆرئاواییەکان ئافرەتێکی حیجابدار دەبینن لە وێنەیەکدا یان لەسەر شەقام ئەو تێڕوانینەیان بۆ دروست دەبێت کە ئەم ئافرەتە هەمووکات لەژێر حیجابدا کپکراوە. ئەوان نازانن کە ئافرەتی موسڵمان حیجاب ناپۆشێت تەنها لەیەك حاڵەتدا نەبێت ئەویش کاتێك پیاوێکی بێگانە چاوی لێیەتی، لەکاتێکدا (٩٥٪)ی کاتەکەی حیجاب ناپۆشێت بەڵکو بە تەواوی جوانییەکەیەوە دەردەکەوێت لەماڵەکەیدا و لە شوێنی کارکردن و خوێندنی ناتێکەڵاو و لە هەموو شوێنێکی تایبەت بە ئافرەتان، وە ئەگەر ئەوانە بەو ئافرەتانە بزانن کە لە هۆڵەکانی ئاهەنگ گێڕاندان و ئەوەیان ببینیایە کە ئافرەتەکان لەبەری دەکەن لە بەهادارترین خشڵ و جوانترین پۆشاك کە دەوڵەمەندترین ئافرەتی ئەوان لەبەری ناکات، وە ئەگەر ئەو میوانداریە



**پڕلەشــــکۆ و ئەو خۆشی و شادی و ئاسوودەییەیان بینیبا ئەوکات هەستیان دەکرد کە لە چ وەهمێکی گەورە دان.**

ئایا حیجاب و تێکەڵاو نەبوون چی پێشکەش بە ئافرەتی موسڵمان کردووە؟

پۆشـــینی حیجاب و خۆدوورگرتن لـــە تێکەڵاوی بووەتە هۆی:

- پاراستنی لە گێچەڵکی سێکسی
- پاراستنی لە دەستدرێژی سێکسی
- پاراستنی لە ناپاکی هاوسەریی
- پاراستنی لە توندوتیژیی خێزانی
- پاراستنی لە ئانەوەی منداڵی ناشەرعی
- پاراستنی لە نەخۆشیە سێکسیەکان
- پاراستنی لە تەڵاق و لێك ترازانی خێزانی
- پاراســـتنی لە تیشکی سەروو وەنەوشەیی کە پێست تێك دەدات و دەبێتەهۆی چرچ ولۆچی و پیری پێست و پەڵە و شێرپەنجەی پێست.



# ناپاکی هاوسەری

ڕێژەی ئەو ئافرەتانەی کە پیاوانی ئەمریکی پەیوەندی سێکسیان لەگەڵ دادەمەزرێنن (٧) ئافرەتە، بەڵکو (٢٩٪)ی پیاوان پەیوەندی سێکسیان لەگەڵ زیاتر لە (١٥) ئافرەت بنیات ناوە لە ژیانیاندا.

سەرچاوە: ناوەندە ئەمریکیەکان بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشیەکاندا
http://www.cdc.gov/nchs/data/ad/ad384.pdf

نیوەی ئەمریکیەکان پەیوەندی ناشەرعی بنیات دەنێن لەگەڵ جگە لە خێزانەکانیان، وە ڕێژەکە لە ئیتاڵیا (٣٨٪) و لە فەڕەنسا (٣٦٪) و لە بەریتانیا (٤٢٪)ە.

سەرچاوە: بی بی سی
http://news.bbc.co.uk/2/hi/uk_news/177333.stm

## بەڵام ئافرەتی موسڵمان بەوە جیادەکرێتەوە:

ئەوەی ئیسلام پێی هەڵستاوە لە فرمان کردن بە حیجاب و قەدەغەکردنی تێکەڵاوی وە حەرامکردن و دانانی سزای تەمێکارانە بۆ پەیوەندیە ناشەرعیەکان ئەمە وای کردووە سنورێك هەبێت بۆ ناپاکی هاوسەری و بووەتە هۆی جێگیربوونی خێزانیی.

### ئازاردان و لێ دوورکەوتنەوە

نزیکەی نیوەی ئافرەتە ئەمریکیەکان کە لە (٧٥) ساڵیان تێپەڕاندووە بەتەنها دەژین.

سەرچاوە: دەزگای ئاماری ئەمریکی

http://www.census.gov/population/www/pop-profile/msla.html

http://www.census.gov/population/international/files/sp/SP52.pdf



## بەڵام ئافرەتی موسڵمان بەوە جیادەکرێتەوە:

لەبەرامبەر ئەو بارەی ئافرەتانی رۆژئاوایی تێیدا دەگوزەرێنن ئافرەتی موسڵمان لەچوارچێوەی خۆشەویستی و چاودێری مناڵ و نەوەکانی دایە، ئەمەش وەك وڵامدانەوەیك بۆ فەرمایشتی خوا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) [پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کێ شایاناترین کەسە بۆ ئەوەی هاوەڵێتی باشی بکەم؟ فەرمووی: دایکت پاشان دایکت پاشان دایکت ئنجا باوکت ئنجا کەسی نزیکتر و نزیکترت.] مسلم گێڕاویەتەوە[1].



(١) صحیح مسلم: ٤٢٢٧

## بێهیوا بوون و ئەشکەنجەی دەروونی

ولاتە خۆرائاواییەکان لە هەموو ولاتانی جیهان ڕێژەی خۆکوشتنی تێدا زیاترە، ساڵانە (٨،٤) ملیۆن کەس بەڕاستی بیر لە خۆکووشتن دەکەنەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان.

سەرچاوە: وەزارەتی تەندروستی ئەمریکی (SAMHSA)
http://www.oas.samhsa.gov/2k10/212/Suicidal-Thoughts.htm

## سەرەرای ئەمەش، پێشرەوە بەناوبانگەکانی هونەر خۆکووشنیان هەڵبژاردووە:

<u>مارلین مونریو</u>: ئەفسانەی سینەمای ئەمریکی.
<u>ماری بێرگمەن</u>: ئەستێرەی ناوداری نواندن، لەساڵی (١٩٩٩) خۆی کووشت.
<u>مادلینا مانول</u>: گۆرانبێژ و ئەستێری ناوداری نواندنی



ڕۆمانی. لەساڵی (٢٠١٠) خۆی کوشت.

مارقوکس هێمنگوای: ئەستێرەی ناوداری نواندنی ئەمریکی ساڵی (١٩٩٦) خۆی کوشت.

لەبەرامبەردا شارەزایان لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی جەختیان لەوە کردۆتەوە کە کەمترین ڕێژەی خۆکووژی لە جیهاندا لای موسڵمانەکان کە نزیکە لە سفر.

## ڕێگای بەرەو بەختەوەری بەختەوەری.. لە ئیسلامدا

لەو کەسایەتیە ناودارانەی کە بەختەوەریان تەنها لە ئیسلامدا بەدی کرد، لەناویانداقەشە و پیاوانی ئاییینیوزانا وبیرمەندان: یوسف ئیستیس (ئەمریکی)، مۆریس بۆکای (فەڕەنسی)، کیپ مور (کەنەدی)، یوسف ئیسلام — پێشووتر کات ستیڤنز (بەریتانی)، مارگریت مارکوس (ئەمریکی)، سوفی بواڤیر (کەنەدی)[1]، وەچەندانی تر.

- وە ئافرەتی موسڵمان جیادەکرێتەوە بە دین و کۆمەڵگا ئیسلامیەکەی.
- کۆمەڵگای موسڵمان پێشەنگە لە قەدەغەکردنی مادده بێهۆشکەرەکان.
- کۆمەڵگای موسڵمان پێشەنگە لە داوێن پاکی و

[1] بۆ زانینی چیرۆکی موسوڵمانبوونی ئەمانە و چەندانی تر بگەڕێوە بۆ ئەم کتێبە : (رحلة ايمانية مع رجال و نساء أسلموا) / عبدالرحمن محمود

ڕێز و ڕەوشت بەرزی.

- کۆمەڵگای موسڵمان پێشەنگە لە چاکەکردن لەگەڵ دایك وباوکدا.
- کۆمەڵگای موسڵمان پێشەنگە لە پەیوەندی و سەخاوەت و میواندۆستی.
- کۆمەڵگای موسڵمان پێشەنگە لە چاکە و خێرخوازی.
- لە ڕەزامەندی و ئاسوودەیی دەروونی. سەرەڕای بوونی هەموو سەختییەکان کەمترین ڕێژەی خۆکوشتنی هەیە لەناو کۆمەڵگاکاندا.
- لە پاراستن لە نەخۆشیە سێکسیەکان.
- ئیسلام لەهەموو ئاینەکان خێراتر بڵاودەبێتەوە لە جیهاندا.

سەرچاوە: **بی بی سی**

http://news.bbc.co.uk/1/shared/spl/hi/middle_east/03/islam_around_the_world/html/default.stm
http://news.bbc.co.uk/hi/arabic/sport/newsid_3157000/3157256.stm

**ئیسلام لە هەموو ئایینەکان خێراتر بڵاوبۆوە.**

سەرچاوە: **سی ئێن ئێن**

http://www.cnn.com/WORLD/9704/14/egypt.islam/

# دوا وتـــــە

خوێنەری بەڕێز ئەوەی کە بینیتو بەرچاوت کەوت لە لاپەڕەکانی پێشوو گشتی هەڵوێستی ڕاستەقینەی ڕۆژئاوا بوو بەرامبەر بە ئافرەت، ئەو زانیارییانەی بەرچاوت کەوت گشتی ڕاستەو حاشا هەڵنەگرە، لێرەوە ئەوە فێردەبین کە ڕۆژئاواو هەموو ئەوانەش کە بە دەهۆڵی ئەوان سەرچۆپییان گرتووەو لافی پێشکەوتنو نوێخوازیو ئازادی ئافـرەت لێدەدەن تا ئەو شـوێنە ئافرەتیـان لا گرنگەو مەبەسـتە کە ئارەزووەکانیان تێردەکات، کاتێـك زانیان ئافرەتێك کەڵکـی چێژلێوەرگرتنی نییەو توانـای ڕابواردنی نەماوە، یان هەیەتی بەڵام لە ئاستی ئەواندا نییەو هەژارە؛ ئەو کاتە لە بازنەی ڕێز دەری دەکەنو بەرەو تەنگەچەڵەمەو لێرەوارو نشێوەکانی ژیانی پڕ ئاسۆرو دەردو تۆق وبەڵا شۆڕی دەکەنەوە، بۆیە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانەی (صلاح الدین) بە پێویستی زانی پوختەباسێك بنووسێت سەبارەت بە ڕێزو گەورەیی ئافرەت لە ئیسلامدا بۆ ئەوەی ببێتە کۆتاییەکی شیرینو چێژبەخش، بۆ ئەوەی خوشکی مسوڵمان ئەم ڕاستیانەی باسمانکرن دڵتەنگی نەکاتو وا نەزانێت بەرنامەیەکی تر نییە دەرگای سـۆزو میهرەبانیو ڕێزی بۆ والابکات، هەر بەم بۆنەیەشەوە پوختەیەك دەخەینە ڕوو بە ناونیشانی:

ڕێزی ئافرەت لە ئاینی ئیسلامدا

بەر لەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام سـەرزەوی ڕووناك بکاتەوەو پڕشنگداری بکات؛ ئافرەتان لە ژیانێکی سەختو سەرگەردانییەکی زۆردا دەگـوزەران، هەروەکو کەلوپەلێکـی بازرگانی مامەڵەیان لەگەڵـدا دەکرا، بەڵکو لەمەش خراپتر وەکو ئاژەڵ و دڕندە سـەیر دەکران. پیاو بۆی هەبوو بە ئارەزووی خۆی دەستبخاتە ناو ماڵو حاڵی ئافرەتەکەی؛ ڕازی بوایە یان نا گرنگ نەبوو، بەڵکو لەمەش

خراپتر خەڵكانی ئەوسا بۆچونو بیروڕایان سەبارەت بە ئافرەت زۆر خراپ بوو؛ گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئەم جۆرە هەڵسوكەوتانەیان بەرامبەر ئافرەت هەبێت:

١. بەشێك لە ڕوسییەكان پێیان وابوو ئافرەت ئاژەڵێكی پیسەو پێویستە هەمیشە خزمەتكاربێت، نابێت ئافرەت پێبكەنێتو خۆشی دەرببڕێت.

٢. جولەكەكان پێیان وابوو هەر كاتێك ئافرەت تووشی سوڕی مانگانە بوو ئەوا پیس دەبێتو نابێت دەستبكاتە هیچ شتێك چونكە پیسی دەكات، بۆیە لە خۆیان دووردەخستەوەو نانیان لەگەڵ نەدەخواردو لەسەر جێگا لەگەڵی نەدەخەوتن، بەڵكو خێوەتگەیەكیان بۆ دادەناو بەزۆر لەوێدا دەیانهێشتەوەو وەكو ئاژەڵ نانو ئاویان بۆی دادەنا تاكو پاكدەبۆوە.

٣. لە لای هیندە بت پەرستەكان ئەوە باوبوو: هەر كاتێك ئافرەتێك مێردەكەی بمردبایە دەبوایە بەشێك لە لاشەی خۆی لەگەڵ لاشەی مێردەكەی بسوتاندبایە.

٤. گاورەكان پێیان وابوو ئافرەت كانییەكە لە كانییەكانی تاوانو خراپەكاری كە هەرگیز بنی نایەت، هەروەها ئافرەت لای ئەوان دەرگایەك بووە لە دەرگاكانی دۆزەخ بۆ پیاوان.

٥. بێباوەڕانو بتپەرستانی قوڕەیش ئافرەتیان زۆر لا سوك بووە؛ بۆیە هەركاتێك كچیان ببوایە ڕەنگیان تێكدەچوو، زۆربەی كات زیندەبەچاڵیان دەكرد، یان بەسوكو ڕیسوایی دەیانهێشتەوە.

ئەوەی كە بینیت ڕێزی ئافرەت بوولە پێش ئیسلام.

## کاتێک ئیسلام هات ئەم ڕێزانەی بە ئافرەت بەخشی:

١. ئافرەت لە ئیسلامدا بەشێکە لە پیاو، هەموو مافێکی ژیانو خۆشگوزەرانی هەیە، کاتێك منداڵە دەبێت جوان پەروەردە بکرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (هەر کەسێك دوو کچ گەورە بکاتو پەروەردەیان بکات بە باشی ئەوا منو ئەو لە ڕۆژی دوایی وەکو ئەم دوو پەنجەیە واین (واتە بەیەکەوە دەبین).

٢. کاتێك ئافرەت گەیشتە تەمەنی گەنجێتیو جوانی سەرپەرشتیارەکەی دەیپارێزێت لە کەسانی چاوبرسیو خراپ، ناهێڵێت یاری بە شەرەفو ناموسییەوە بکرێت، بەڵکو دەیداتە دەست کەسێك کە بیپارێزێتو ئافرەتەکەش لێی ڕازی بێت.

٣. کاتێك ئافرەت شووی کرد ئیسلام داوای لە مێردەکەی کردووە کە لەگەڵیدا باشبێتو ڕێزی لێبگرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (باش مامەڵە لەگەڵ ئافرەتان بکەن چونکە ئەوان یارمەتیدەری ئێوەن)، هەروەها فەرموویەتی: (باشترین کەستان ئەو کەسەتانە کە بۆ خێزانەکانیان باشنو چاکن، من لە هەمووتان باشترم بۆ خێزانمو کەسو کارم).

٤. کاتێك ئافرەت بوو بە دایك ئیسلام لەسەر ئێمەی واجبکردووە لە باوك زیاتر ڕێزی لێبگرین، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەپێش هەموو کەس لەگەڵ کێدا باشبم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دایکت، کابرا وتی پاشان کێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دایکت، کابرا وتی پاشان کێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دایکت کابرا وتی: پاشان کێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پاشان باوکت.

کەواتە تا یەك جــار چاکە لەگەڵ باوك دەکرێت کە پیاوە دەبێت سێ جار چاکە لەگەڵ دایك بکرێت کە ئافرەتە.

٥. کاتێــك ئافرەت خوشــك بــوو دەبێت ڕێــزی لێبگیرێتو ســەردانیبکرێتو یارمەتی بدرێت، ئەگەر باوکی نەمابوو دەبێت براکەی جوان بەخێوی بکات.

٦. کاتێك پوور بوو وەکو دایك ڕێزی لێدەگیرێت.

٧. کاتێــك ئافرەت داپیرە (نەنك) بوو ئەوا وەکو پاشــایەك لە ماڵــەوە ســەیردەکرێتو بە هەموویان بەخێــوی دەکەنو بە گەورەی خۆیانی دادەنێن، بەڵکو بەردەوام ڕاوێژی پێدەکرێتو قسەی لێوەردەگیرێت.

٨. کاتێــك ئافرەت خزمی پیــاو نەبوو ئەوا پێویســتە پیاوان هەرگیز ئەزیەتی نەدەن؛ نە بە دەست نە بەلاشە، هەروەها بە چاوی خراپەکارییەوە ســەیری نەکەن، بەڵکو وەکو خوشکی خۆیان ڕێزی لێبگرن.

٩. لە هەموو ئەمانە زیاتر خوای گەورە ســوڕەتێکی بەناوی ئافرەتانــەوە دابەزانــدووە ســوڕەتی (النســاء)، هەروەها سوڕەتێکی تری بە ناوی (مریم) دوە دابەزاندووە کە ئافرەتە.

ئەمــەو چەندین مافی تر کە ئیســلام بۆ ئافرەتــی داناوە، لە کۆتاییدا داواکارین لە خوای گەورە گشــت لایەکمان سەرفرازو ســەرکەوتوو بکات، خوشــکانمان بپارێزێت لە خەڵکانی خراپو نیەت خراپ. هیدایەتو ڕێنماییان بکات بۆلای ئاینە ڕاستەکەی خۆی. آمین. وصلى الله وســلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.



ئامادەکردن و پشتڕاستکردنەوەی زانیاری و ئامارەکانی ناو ئەم بڵاوکراوەیە لە سەرچاوەی خۆرئاوایی فەرمی و باوەڕپێکراوەوە:

(١٠) مانگی خایاندووە (واتە نزیکەی ١٤٠٠ کاتژمێر)، وە هەموو ئامارەکان پشتڕاستکراونەتەوە لەپێگەی (شبهات وبیان: www.shobohat.com) بەبەستەری ڕاستەوخۆی سەرچاوە بنەڕەتیەکانیان.

